# شەڕی خوێناوی بەرە بەیان و تاریکی :

دەستم لە شەڕێکا پێکراو دواین فیشەکی تریفەی بەر کەوت
بۆیە لەسەری پەنجەکانمەوە
دڵۆپ دڵۆپ مانگ دەچۆڕێ
شەرم بینیوە، بەڵام بە وێنەی ئەم شەڕە، خوێناوی نەبوە
بەرە بەیان دەستی پڕ بوە ، لە ئەستێرەی خوێناوی و
بەسەر برژانگی وەنەوشەوە، ئاو دەبات
بۆ تەڕکردنی دەمی قومریەکان
ئەم تونێلە قوڵە بۆ کوێ لێدەدات ....تاریکی...؟
وردە زیخی ئەم هەمو نورە، بەسە بۆ ئەوەی
چیتر تاریکی، پێویستی بە ڕوناکی بەرە بەیان نەبێت
ئەوەی لە شەودا دەکوژرێت
دڵۆپە ئیشراقەکانی ڕوناکیە
ئەوەی گیان ئەدا، لە بەرە بەیانا

ئەو تاریکیە بە هەیبەتەیە، کە خەوی لێکەوتوە
لە دڵی گوڵە میناداا
ئەم شەڕە خوێناویە، بەورێکی مۆلەق کردوە
پێیەکی وا لە بەیاناو پێیەکی وا لە ناو شەوا
بۆیە، لە پشت بەردێکەوە هەڵکورماوە و دەگری
بەڵام چۆن گریانێك....؟!
لە چاوێکیەوە
قەترە قەترە، بەرە بەیان هەڵئەرێژێ و
لە چاوەکەی تریشیەوە
تاریکی خوڕ خوڕ دێتە خوارێ
دەبێ سینەی ڕوتی شەو
کەی دوگمەی کراسەکەی بترازێنێ؟
تــا گریانی بەورێك تیایا سکونەت بکا
دەڵێی خوا کاتی قاتی کردوە ،
تا بەورێك تیایا بگری.....
دەبێ زەریا، کەی قۆپچەی کراسەکەی دابخا؟

تا چیتر گۆی مەمکی
بە تیشکی هەتاو نەڕوشێ
هەرگیز بەور خەیاڵی ئاو، ناشەمزێنێ
بەور لە ناو خەونی زەریادا، دەخەوێت و نایەڵێت
ئاو داچڵەکێت و خەبەری بێتەوە
هەر بۆیە تەنیا، لە بەرە بەیانێکی دەستنوێژ نەشکاو، بەتاریکیدا دەردەکەوێ
چونکە تەنیا لەو دەمەدا
ئاو خەوی لێکەوتوە

## گفتوگۆی بەوری بەیان و جەلادێکی گرینۆك :

دەبێت بێم و وەك فریادڕەسێك بتڕفێنم
تا چیتر لەوە زیاتر
لە ناو گریانا فەنا نەبیت

دەبێت بێم و بترِفێنم
تا چیتر لەوە زیاتر
خوێن بەسەر خەنجەرەکەتەوە سەما نەکات و گۆرانی نەچرِێت
تەماشاکە......
چەند خەنجەرت رِۆکرد، بە دڵە نامورادەکانا
ئەوەندە، بە دزیەوە بۆ نامورادی خۆت گریایت
چەند گوڵی لارِێت، لە کاتی ئاو خواردنەوەدا
بە پەنجەی شایەتومان خنکاند
ئەوەندە تاڵی سپیت لەخۆتا هەڵکەند
تا پیرێتیت، لە خەڵك بشاریتەوە
دەبێت بێم و بترِفێنم، تا چیتر
لەم قیامەتی گەرمایەدا، هەڵنەقرچێیت
سەری هەرچی درەخت هەیە پەرِاندت
سێبەری تەنیا درەختێکت نەهێشتەوە، تا هیچ نەبێت
تێر تێر لە ژێریا بگریت
دێم و دەتبەم، تەنیا ترین پیاوی دنیا

دەترپفێنم و تۆش
خەنجەرەکەت لە دڵی دەمە شێریکا بنێژە
چونکە هەرفریای خۆت دەکەوم نەك خەنجەرەکەت
ئەو هەمو شەوەت سەر بری
ئەو هەمو ئەستێرەیەت بەبریندارى لە بنی کانیەکانا جێهێشت و
وەنەوزێکت نەدا، زاڵم
تازە دەتەوێت بە دیار ژماردنی ئەستێرەکانەوە چاو لێك بنێیت و بخەویت؟
ئەی جەلادی گرینۆك

## وەڵامی جەلاد:

چۆن دێیت و چۆن دەمرپفێنی ئازاد بە
کە من ئازاد بوم لەوەی
چۆن خەزێنەی کەونم تالان کرد، لە جوانی

که من ئازاد بوم لەوەی

دەمی هەمو کانیەکانی مەرگم تەقاندەوە

که من ئازاد بوم لەوەی

خەنجەرم فێر کرد، بۆ هەتا هەتایە نەنوێت و

هەرگیز وەنەوزێکیش نەدات

ئیدی تۆ بۆ ئازاد نەبیت....؟

بەڵام ئەی بەور، که هاتی تەنیا تکایەکم هەیە

ئەو پێیە چڕنوکاویەتم لێگیر بکە، کەوا لە ناو تاریکیدا

چونکە زیرەی مەرگ ئەکەم، لە ڕوناکیا بتبینم

## گفتوگۆی باخەوانی نور و بەوری بەیان :

چەند جوانە شکۆی ئەم نورەت خودایە

بەسەر سەوزی ئەم خەیارەوە

ـ بـــا ـ بە خەتێکی خوار و خێچ ئێوارەی دەنوسیەوە
منیش دەمویست دوا دڵۆپی ئەم شەرابی کۆنە ساڵە
بەرمەوە سەر نوتفەی ئەوەڵین دەنکە ترێ
من کە نەتوانم ئاوا نازی شەراب بکێشم
چۆن دەتوانم...؟
ببمە باخەوانی باخی نور
من دەستم لە ناو سورایی گێلاسا بەجێدەهێڵم
تۆ چڕنوکت لە ناو خوێنا لێون دەبێت
من دەتوانم هەرچی تاریکایی ناو ڕۆحم هەیە
بە نوری کۆخێکی قڵیشاو ڕوناك بکەمەوە
تۆ دەتوانی دەریا بخەیتە سەر تل و
دەمولێوی وشکهەڵاتوی بەرە بەیانی پێتەڕ کەیت
دڵم لەبەینی دو پەلك نەعنادا، لە شیرینترین خەودایە
تۆ دەتوانی باخێك خەو لێبخەیت، بەسەر دڵی ئاگرەوە
دێیت و دەڵێی: .
من دەتوانم کێوی جوانی منداڵ کون بکەم و

لەگەڵیا بنوم هەتا ...مەرگ
بەڵام وەك تۆ ناتوانم ببمە باخەوانی نور
دەمەوێ دەستێ لە پەنجەت وەربدەم
کەچی پەلکێ ڕێحانە و پەنجەتم لێتێك دەچێت
دەمەوێ بۆنی هەناسەت بکەم
کەچی دەکەوم بەسەر، میشە میشی توتڕکێکی قەراخ ڕێدا
دەمەوێ بە قوڵترین ڕوانین مەحفت بکەمەوە
کەچی سەرنجی چوالەیەکی تەڕ
دەمکاتە خۆڵ و غوبار
عومرێکە وام لە هەولا
زەفەر بە خەیاڵی ناو نوێژێکت ببەم
کەچی دو دڵۆپ ئاوی سەر بەردە نوێژەکەت
هەلا هەلام دەکات و دەبمە قەقنەس
ئەرێ بەڕاست....؟
تۆ نوری ئەی باخەوان یـــان باخەوانی نوری؟



PDF 4 KURD

# بەوری بەیان و خوداناس، ئاوا ئەدوان :

بەم نامورادیەمەوە
چی بکەم لەباخەکانی عەدەن
ئەم هەمو جۆگەی شیر و شەربەتو شەرابە
تینوێتیم ناشکێنن و سوکنایی نادەن، بە دڵم
لە ناو میوە سورئاڵەکانی بەهەشتا
چۆن بتوانم ئارام بگرم؟
ئەم بەهەشتەی پێتداوم چی لێبکەم؟
کە دەبینم کەسێك دەبێت بۆ هەتا هەتایە
لە ناو دۆزەخا بسوتێ
سەفا بەخش نیە............هیـــچ
بە عیشقەوە شەوم دەخواردەوە و بینم پێوە دەنا
بینم پێوە دەناو دەمم لێبەر نەئەدا
تا سپێدە شکۆفەی دەکرد، لە نێو جامەکەی دەستما

کەچی بەد مەستەکانی شەو، دەرشانەوە
بەسەر ئەو گەڵایانەدا، کە عیشوەیان دەبەخشیەوە و
منەتیشیان بەسەر کەسا نەدەکرد
سەفا بەخش نیە...........ئـاخر
بەو هەمو نازەوە
نازنازم لە دەستما ئەڕواند و چرۆی نەدەکرد
کە بەیانی سەرنجم ئەدا
گۆچانەکەی باوکم چرۆی دەکردو باقە باقە گوڵی دەگرت
من و تۆ، لەسەر خوانێك بەیەکدەگەین
ڕەنگە خوانی ئەمرۆ نەبێت
من و تۆ، دەستڕێژی ئەسەفێك دەمانکاتە بێژنگ
کەسبەینێ دەزانرێ، چ حەقیقەتێکی تاڵە.....
من نوێژم لە ناو دڵی بەرددا، دەشاردەوە
خودام لە ناو تنۆکە ئاودا، جێدەهێشت
تا ئاگای لە ماسیەکان بێت بێدەنگی نەیان خنکێنێت
ماڵم بەسەر نینۆکی تۆوە دروست دەکرد بۆ شەوگەردەکان

کەچی تۆ لە بەفر بێدەنگ تر بوی ئەی بەوری بەیان
سەختە جلەو کردنی ڕەشەبا، کە لە ناو نورا هەڵدەکات
کەچی پێت دەوتم : .
لێی گەڕێ...... با هەڵبکات
لێی گەڕێ من دەزانم دێت و لە ناو ڕۆحی منا ساکن دەبێت
ئەگەر تۆ دەستی میهرەبانی خودا بیت
ئەوا من دەستەکەی تریم، کە تورەییە
ئەگەر تۆ دیوێکی تری تەنیایی ڕۆحی خودا بیت
ئەوا من تەنیاترین ڕۆحی خودام
بۆیە هەتا ڕۆژی قیامەت
چنگ گیر بکەم لە چاوانت و ناو دڵت هەڵبکۆڵم
جگە لە خۆم لە ناو تۆدا
دەستم بەر هیچی تر ناکەوێت......خوداناس
من و تۆ دوا  دیدارمان
شەڕی بەشکردنی تەنیاییە، لە شوێنێکا
ئەو شوێنە نە تاریکاییە و نەڕوناکایی

## بەوری بەیان و ژن، ئـاوا ئەدوان :

هێشو هێشو ترێ، لە مێوی شەو دەڕنیت
کە چاوانت هۆن هۆن شەرابی ئاڵی لێدا دەچۆڕێ
ئیدی بۆچی زەخیرە بۆ شەراب دەخەیت؟ دەریا ژن
جوانە ئەم زەمیلەیەیی لەپرچی خۆت چنیوتە
خۆڵە مێشی ئەم نەردە، بە فوی تۆ ناگەشێتەوە
تازە ئیتر چاوەڕوانی من نەکەیت
کە لورەی پڕ نزای من هەمیشە لە قورگتا بێت
زریکەی دەریا لوشی تۆ دایم لەڕۆحی مندا بێت
ئیدی چ پێویست دەکات
بێم و بتڕفێنم...... ئەی دەریا ژن
گریانی من هەر لە چاوانی تۆدا، دەوێرێ خۆی ئاشکرا بکات
چڕنوکی من هەر لەناو تەنیایی تۆدا دەتوانێ بە کەماڵی ئیسراحەت
نا ئومێدی لێپچۆڕێ

من بەورێکم نیوەم لەجنسی تۆیە و
نیوەکەی تریشم لە جنسی تەنیایی
ئاخر بەم هەمو تەنیاییەمانەوە چیبکەین.....چـــی؟
باش دەزانم ڕۆژێ دێ، ڕەنگە شەویك بێت
تەنیایی هەردوکمان دەکوژێ، ئەی دەریا ژن

## دوا وەسوەسەی بەوری بەیان :

لاسایی کردنەوەی ئاوو
تەکاندنی توی تاریکی، بۆ سەر سنگی بەرە بەیان
سڕینی چاوی تەڕی ئەستێرەیەك
بە لەچکەی ئەو ژنەی خۆیم نەفڕاند
تەنیا دەسماڵەکەی سەریم هێنا، بۆ یادگاری
ڕزگارکردنی چەندین دڵۆپە باران
کە لە قوڕا غەرق دەبون و دەکەوتنە حاڵەتی خنکان

من کە شایەدی هەمو ئەمانەم و تۆ هەرگیز ناتوانی بیانبینی
ئیدی حەسودی بەچیت ببەم ئەی ئینسان؟
تۆ دەسوتێیت و هەرگیز ناشزانی
ئاگر چیە
دەخنکێیت و هەرگیز
لە فەلسەفەی تەڕایی تێناگەیت
مایە پوچیت لە جوانی و هەمانەی بەتاڵیت لە نور
چیت هەیە حەسودی پێببەم..... دەپێم بڵێ؟
ڕەنگێك نەماوە لە دنیادا، لە ناو چاوما نەنوستبێ
تەنیا ڕەنگێك چیە، ناوێرێ توخنت بکەوێ
چونکە تۆ ڕاوچی ڕەنگی، ئەی ئینسان
ئەو هەمو هەنگە
لە ناو هەنگوینا خۆیان خنکاند و نەگەڕانەوە، تا ناو دەمت شیرین بکەن
کەچی هەر ژەهری مارە، گوفتارت
ئیدی حەسودی بە چیت ببەم.....؟
ئەو هەمو فیشەکەتان نا، بە باڵی هەڵۆکانەوە

**لە شیرینی خەودا**
**کەچی بەرگەی یەك فیشەکی حەقیقەت ناگرن**
**مەستن بە وەهمی پــڕ بون لـە گـەورەیی**
**کـەچی جورئەتتان نیە**
**تۆزێ بـە دیـأر شـەوەوە ڕا بمێنن، ئــەی ئینسان**
**دەپێم بـلێـن حـــەسودی بـە چیتان ببەم**...............؟

# تەرتیلەی یەکەم /

ئەم دەنگە لە قولایدایە , مەگەر هەر بێدەنگی پێی بوێرێ
بەسەر قامکە وردیلەکانتەوە
مانگ و ئەستێرە شەڕیانە , لەسەر ئەوەی
کامیان زووتر بچنە ناو دەستەکانتەوە و
تالەوێوە
عەرشی موعەللای دڵت داگیربکەن ..... نارینا
یەك سەدەیە باسی تەڕی بارانت بۆ دەکەم
کەچی پێم دەڵێیت بابە
دەمولێوی وشکەڵاتوی ئەم بارانە کەی تەڕدەبێ ....؟
وێڵی بەدوای مەرزوبومێکا
تالەشولاری بارانی تیاتەڕببێ
کەچی لەم قیامەتی بارانەدا
روتوقوتو بێباك لەوەی ڕەهێلەی باران چۆن دەتکوتێ
دەستەکانت کردۆتە کوخێ بچکۆلە بۆ پەپولەیەك

تادواسلاوی نوێژەکەی تیابداتەوە .....نارینا

یەکەم جار

خودا مرۆڤی دروست کرد نەك منالْ

چونکە زەحمەت بوو

خۆی لەخۆی دابتاشیْ

ئەخیر کوفر ئێمە کردمان

مندالْمان کرد بەمرۆڤ و دەسکاری جوگرافیای ڕۆحی خودامان کرد

هەر بۆیە هەتادەمرین

نەدەحەسێینەوە و

نەدەستمان لەخوا گیردەبیْ و

نەدەتوانین بگەڕێینەوە مندالّی

## تەرتیلەی دووەم/

بەو دەستە بچکۆلانانەت

چ جەنگێکی گەورەت بەرپاکردوە لەگەلْ زەبەلاحی سێ بەرەکەتا

که چی من بەم گه ورەییەمەوە
جەنگە بچوکەکان تۆقاندومیان
من دەستە خرپنەکانتم, له وژەی با دەشاردەوە
تا نه بێتە شەختە و ڕەق هه ڵنەیەت
کەچی تۆ هەمو سەحەرێ تۆفانی با,لە چاوتەوە هەڵیدەکردو دەتوت:
بابە ئەگەر دەستم بەرنەدەی
لە ناو رەنگی "با"دا وەها خۆم وندەکەم
هەرگیزچاوت پێم نەکەوێتەوە
دەنگێك بەڕەنگێکی سورئاڵەوە دێت و من نایبینم
نوێژێك بەبرینداری دەگات و
بەلێواری ئەژنۆکانتەوە داتناوەو
ئاوی گەڵای گیلاخە دەکەیت بە دەمیەوە
ئەم بۆشاییە ترسناکەی لە نێوان من و تۆ دایە
هەرلەدوری نێوان
ئاو و مەرکانەیەکی تینوی لەچەند لاوە شکاودەچێت
ئێمە پێش ئەوەی بخەوین پێدەکەنین

خراپ حراپ پێدەکەنین
تۆ زۆر بە کەسکونی دەگریت تابخەویت
کەهەڵدەسین
ئێمە لە هەویری ترشاو دەچین
تۆش هەر وەکو خەرمانەی مانگ
خەولەناو چاوەکانتا هێندە جوانە هەر لەو جوانیە دەچیٚ
کەلەناو تەمبورێکی ئەرمەنیدا خەوی لێکەوتووە
چەند جوان و بەویقارە ئەم نوستنەت
هەر لەخەوی شەراب دەچێت
لەناو دەفرێکی کۆنە سالآ ........ نارینا

## تەرتیلەی سێیەم /

ئەم دەنگە لە قولآیدایە , مەگەر هەر بێدەنگی پێی بوێریٚ
ئەم ئایەتە لەناو دڕکا تار دەژەنیٚ و
لەچنگی ئێوارەیەکی دڵتەنگا سەمادەکات



PDF 4 KURD

ئەم خودایە بۆچی دستی هەڵگرت
لەناردنی ئایەتەکان و سەرگەردانووبەرەڵاویڵی کردین و
هەرچی ناوی ئیمان بوو بەستی لە باڵی پەپولەیەك
ئەویش خۆی کێشا بە گڕی چرای بەر هەیوانەکەم دا
ئاخرتۆ کەڕوتت کردومەتەوە لەئیمان و تالآنت کردوم
ئەم منداڵەت بۆ کرد بە تووشمەوە ......؟
ئاخر ئەی خۆت نازانیت چەند ترسناکە .....!
باوەشت پڕ پڕ بێت لە منداڵێك و
دڵت خاڵی خاڵی بێت لەئیمان .....
بیٚ دادیە ئەم بیماریە
بیٚ سەمەرە ئەم بارانە
بەهیچ ناچیٚ ئەم گۆرانی چرینەت ئەی – با –
ئەوەتا ، کەسورمە لەچاوی دۆست دەفڕێنی
من لێرەوە پەردەی پەنجەرەکەم دەلەرێتەوە
کەسەری پەلکە گیایەك دەخەیتە سەر ڕانت و بۆی دەڕوانیت هەتا دەمریٚ
منیش لێرە نەسیمێك باوەشێنی دڵم دەکاتو دەڵیٚ

خواسەبوریت بدا دەسەلاتی منی تیانەبوو
سەرم لەمە دەرناچێ ئەی – با –
چۆن توانیت خوا بفرێنیت و
لەم بێشکەیەدا ئاوا گغە گغە بکات
ئاخر بەم ڕوتو قوتیەمەوە من چی بکەم لەم منداڵە ...؟

## تەرتیلەی چوارەم /

لەقولایی دەریادا
دەنك دەنك دلۆپی هەڵڕژاوی باران دەچنیتەوە
من لەژێر ئەم چەترەدا
خۆم لەلێزمەی باران دەدزمەوە
من لە لرفە لرفی دەریا زۆر دەترسم
کەچی تۆدەتەوێ هەرچی کەفی دەریای دنیاهەیە
بەو دەمە بچکۆلانەیەت هەڵبلوشی
دەبزانە من و تۆ چەندە دورین لەیەکتر

تۆ مناڵێك شەلاڵی بەعارەقی تەڕدەریا
منێك تینو تینوی ناوئەم بیابانە
ئاخر کەئەوەندە دوربین لەیەکتر چۆن دەتوانم
بڕۆمەوە سەرئەوەڵین نوتفە
ئەو نوتفەیەی کەتۆی لەناو مندا خوڵقاند
چەند نازەنینی ....نارینا
کەئێواران سەرت دەکەیت بەناو تەمی ئاوابوونا
شەودەگوشیت و دەڵێیت بابە هەڵیخە بەو تەنافەدا
ئەی نابینی چۆن خوساوەو ئاوبەشانوملیدا دێتە خوارەوە ؟
پرتەقالێك هەڵدەچۆڕێنیتە ناو پیاڵە چاییەکەی بەردەمت و هەڵی ٚ ئەدەی
لەگەلأی پرتەقاڵ کۆلارە دروست دەکەیت
بەدەنکە بەرسیلەکان هەڵماقۆدەکەی
تریقە تریق پێدەکەنیت و دەڵێی :
بابە بانەچینە ژورەوە
بەڵکو مانگ لەسەفەر بگەڕێتەوە
ئەم دەنگە مەستە بە ڕەنگیٚ کەمن ناتوانم ببینم

ئەم ڕەنگە مەستە بەدەنگیٚ کەلە قولاٚیدایە
مەگەر هەر بێدەنگی پێی بوێرێت

## تەرتیلەی پێنجەم /

دەستمان لەیەکتر دەترازیٚ و لێك وندەبین
وەك ئەوەی نەمن هەبووبم نەتۆ
تۆ دەبیتە گەردیلە نەبینراوەکانی ناو ڕشەبا
بەیانیەکی قایم نوێژ
بەیانیەك کەڕۆشنایی هێشتا زەفەری پێنەبردبیٚ
دێیتەوەو بەگسکێك گەلاٚی هەلٚوەریوی عومری من کۆئەکەیتەوە
دێیتەوە و دمبینی وام لەدەمی زولٚمەتێکا
گۆرانی بۆ دولبەرێکی خۆلاٚوی دەلٚیم
سوالٚی تۆزیٚ سورمەم دەکرد بۆ چاوانم
کەچی خاکی سورمە ڕێژی کەنعانم نەدەبینی لەپالٚ دەستما

چ یەعقوبێكی گوناهبارو نادان بوو نەم توانی
لەچاڵی ڕشی كەنعانا یوسف ببینم
كەچی لەودوری دورەوەو لە میسر بۆنی كراسەكەیم دەكرد
چ یەعقوبێكی چارە ڕەش و گوناهبار بووم
هەرتەنها جارێ بۆتاقی كردنەوە
خواخۆی كرد بە كوڕمن و منیش ناوم لێنا یوسف
هەر كەلێی غافڵبووم
سپاردیان بە چاڵی ڕەشی كەنعان
توخوا بەئەسپایی پێ لەسەر خاكی كەنعان دابنێن
باخودا لە و بیرەدا ڕانەچڵەكێ
تووخوا بەكچانی ئەوێ بلێن
چاویان بەخاكی سورمەی كەنعان نەڕێژن
باپێڵوی چاوەكانی یوسف نەشەمزێ
تازە سورمەی ئەو خاكە دەرمان نییەو دەرمانیش نابێت
بۆ چاوی هیچ گوناهبارێك
تازەمن چیم پێدەكرێ جگەلەوەی بڵێم

*(ئەی بادی صەبا نە من ببە و نە کەڵکیشی هەیە نامە
تەشریحی ئەم هەموو غەم و گوناهبارییەم نایەتە تەحریر )

## تەرتیلەی شەشەم /

ئەم دەنگە لەقولاّیدایە مەگەر هەر بێدەنگی پێی بوێرێ
کەڵکەڵەی ئەم ئەفسونەت
دەمباتەوە نێو نەوای شمشالێکی سبەینێوە
کەڕەنگە بایە قوشێك بیژەنێ
نەشتەری ئەو هەموو جوانیەت نیشتۆتە سەر پەڕەی دڵم
ئاخر چیبکەم خوێنم تیانەماوە تاجۆگەلەببەستێ
کێ دەڵێت جوانی نەشتەر نییە بابێت سەیری
هەنارەکەی ناو دەستی نارینابکات چۆن لەداخا شەقی بردوەو
دڵۆپ دڵۆپ جواناوی سوری لێدەتکێت
خۆزگەدەمزانی نارینا .....چ سحرێکە
بەو ڕوتو قوتیە ڕاکشاوی بێباك لەو هەموو تۆف وسەرمایە

تەنیا گەڵای*گوڵەشیرین شۆخێکت داوە بەخۆتا و دەڵێی بابە
تازەدەبێت بەئاواتی خەوی ژێر گەڵای گوڵە شیرین شۆخێکەوە سەر بنێیتەوە
پەلم بگریت یان پەلم نەگریت بەچی دەچێت ؟
من گریانی تارژەنێکی گوناهبارم
دەبێ تاقیامەت هەربکولێمەوە
چیم لێدەکەی لێم بکە ......نارینا
ئەوەندە دەزانم لەگەڵ هەرشتێکدا کۆمبکەیتەوە یەکسانم بەخۆم
کەخۆم جگەلە گوناهباری و پەشیمانی شتێکی دیکەنیە
دەرم بکەی لەهەرشتێك وەهەرشتێکیشم لێدەربکەی
یەکسان دەبم بە تاقیامەت گریان
کەڕەتی هەرشتێکم بکەی یەکسانم بە
هەرمێیەکی تەڕی جێماوی ژێربارانێکی پیر ,پیرتر لەم بێتاقەتیەی من
تازە ئیتر بەچی ئەچێت
پەلم بگریت یان پەلم نەگریت .... نارینا

# تەرتیلەی حەوتەم /

هەموومانت دۆزیەوە خۆت نەبیٚ
هەموومانت فڕیٚدایە بەر فوارەی ئەم عەزابەوە
بەمشت دەریات بۆ هیٚناینە ناوماڵەکانمانەوە و پیٚت وتین :
هەڵیمژن بۆنی ئەم سەرابە , هیٚندە بە قوڵی هەڵیمژن
تائاویٚنەی گشت دەریاکانی دنیا لە دەستانا وردوو خاش دەبیٚ
هەموومانت فڕیٚدایە بەر تاشە تاشی ئەم زوڵمەتەوەو پیٚت وتین :
قوڵ بڕوانن بۆ نوری ئەم زولمەتە هیٚندە بە قوڵی بڕوانن
تادڵتان دەبیٚتەوە بە چنگیٚ خویٚن لەناو لەپی دەستانا
تۆ نەلە ئاویٚنەی دەریاکانا خۆت بینی
نەلەناو دلۆپیٚ زوڵمەتی سەر جەستەی نورانیمانا توانیت سەیریٚکی خۆت
بکەی
وا دڵیشمان بوو بە چنگیٚك خویٚنی سەر هەڵگرتوو
دڵنیام کەناشتوانیت لەناو خویٚندا دەر بکەویت و هەڵ بکەی
خودایە دەزانم هەر لەبەر ئەمانەبوو

مندالّت لەخۆت داتاشی و دروست کرد , تادەسست بەر خۆت بکەویت و
خۆت ببینی
خودایە ئاخر تۆ دلّمت کردە گلّمتکیّ خوێن
تازەچی بکەم .....؟
ئەم منالّە لەکویما هەلّبگرم ........!
خودایە ئەم منالّیەت ببورە ئەم خوداییەت لەکویّما بشارمەوە
ئەم دەنگە لە قولاّیدایە مەگەر هەر بێدەنگی پیّی بویّریّت

* بەیتێکی (حاجی قادری کۆیی) ە
** ( گولّە شیرین شۆخ ) جۆرە گولیّکە

خودایە تۆ کەهیچ  سودمەند و دڵخۆشنیت بەوەی
ملت بۆ کەچ بکەم‌و
باکیشت نیە لەوەی لێت یاخیبم
ئەدی بۆ دروستت کردم ؟!
لە ناو چ  مانایەکدا ,جێگەیەك بۆ بونم  دەکەیتەوە؟!
تۆ لەترسی تەنیایی خۆت
تۆ لەترسی ئەوەی
نەبادا لە بیرت بکەم و باست نەکەم
نەتهێشت دەستت لێبدەم
کەچی دەستمت چزاند بە هەمو پشکۆکانا
هەرچی فیشەکی بەیەکگەیشتن هەیە
لە کەللەی سەرمدا  خاڵی خاڵیت کردەوە
لە دۆزەخەکانی بە یەکگەیشتنا بۆ سوتاندمت؟
نەهاتیت و  پێکی ژەهری  بەیەکگەیشتنت لەگەلاً  نۆش نەکردم
دەزانم بۆ نەهاتی؟

هەر لە بەر ئە وەی بیرت بکەم و  هەمیشە لە دوت بگەڕێم
تەماشاکە ئەم بە یەکنەگەیشتنەی من و خودا چەندە جوانە؟!
تەماشەکەو  کراسێك لەم بە یەکنەگەیشتنەی من و خودا  دادڕە
تۆ ڕەحمت پڕە لەئاگرو چاوت کەیلی تۆفانی تەنیایی
من دەستم دەشتێکە لە لالەزاری مەرگ و
ڕۆحم ئاگری غوربەت
کرد ویەتیە قە قنەس
تەماشاکە...
ئەم لە یەکتر ونبونە چە نە جوانە!
هەر لە بێدەنگی بەفر ئەچی... هەوریلار
مەرکانەیەك هەر خۆڵ بە سەری خۆیدا  دەکات و
لە ترسناکی بیابان حاڵی نابێت
بیابان بەو هەموو  بەرینیەی خۆیەوە
بیابان بە دەست و پلە  قڵیشاوە کانیەوە
لەناو ئەم مە رکانەیەدا  ڕاکشاوەو
بلوێری خۆڵ ئەژەنی

کەچی ئاو سەماناکات و گوێم لێیە
لە ژێر لێوەوە...دەڵێ:
کە پە نجەیەك لەسەر بلوێر بێت و خوێنی لێنە تکێ
کە پەنجەرەی سەرابێ
تەرجەمەی ئەو هەموو بێدەنگیەی بیابانی پێنەکرێ
کە جوانیی مەرکانەیەك بێت, خاڵی خاڵی لە تە ڕایی
کە حە یرانێ سور نەبێ لەخوێنی چاوەروانیا
چۆن ئە توانم بڕەقسێم و  گۆرانی بڵێم....هەوریلار
دەئیتر با ئەم سەفەرە هەر تولانی بێت
با ئەم برینە هەر بدرەوشێتەوە
با ئەم یاقیقی تەنیاییە
هەر لە ملی کچانی هەوریلارا زرەنگەی بێ
با منیش لەم چوڵی قوڵفی مەحشەرەدا
لە ناو دەشتی زەنگیانە ئاسای خوڵا
هەر لە دوی چاوی خودا بگەڕێم....هەوریلار
لەنێوان من و خۆما

ئاشوبێکی فیتنەگێڕ حاکم و سالارە
لە نێوان چاوم و  فرمێسکەکانما
تەرمی ئەو هەموو بەهێی خۆشەویستیە کەوتوە
جەنازەی گەڵای ئەو هەموو  گوڵەبەڕۆژەیە  سەرگەردانە
نە چاوم بۆیان دەبێت بەگۆڕو
نە لەناو فرمێسکەکانما جێگەیان دەبێتەوە
تەماشەکە....ئەم لە یەکتر بزربونە
چەندە ڕەنگزەردە... هەوریلار
هەر لە ڕەنگی عەشق ئەچێ
تۆ دەڕژێیت و هەرپڕی لە تینوێتی
من قوڵپ ئەدەم و  هەرپڕم لە چۆڵەوانی
ئەم دەرگایە لە ڕاستیا دەرگا نییە
ئەو پەنجەرەیە  هەر لە تەمی ناو دەستەکانم ئەچێ
چەترەکەت تورهەڵدە مەلول گیان
سێپەرە جوانە  بۆ چەتر
دوگمەی کراسەکەت بترازێنە

ئەی نازانی!!

(لە دوگمەی سینە دوێنیٚ نوێژی شێوان)*

بەیانی نەدا ,خەڵتانی خوێن بوو

سپێدەی باغی سێوان

تە ماشاکە....ئەم پرتەقاڵی خوێنە

بەم تەنگی نوێژی شێوانە

چەندە پڕ کەیف و  سرورە... هەوریلار

کە لە گەڵای سنەوبەر کراسێك ئەدورم بۆ باران

کە لە سینەی ڕوتی هەرێزێکا

چاوی پەپولەیەك دەکەمە خەو

کە لەناو دەفی دەروێشێکا  ئەم هەمو دڵۆپی گریانە

فێری سەما دەکەم

کە لەناو چارەکەی ئەم کچە هەوریلارەدا

سادەیی و ساکاری فێری لەنجەولار ئەکەم

کە سینەم پڕ دەبیٚ لە تەواری خوێناوی

ئیدی هەر ماوەتەوە بڵێم: ئەم سەمایە بەخوێنەوە

ئەم سەمایە بە سوتانی قەقنەسەکانی عەشقەوە
چەن نازەنینە.... هە وریلار
کە باران چۆك دائەداتە سەر دەمولێوی گەڵایەك
کە سەرپۆشی دەربەدەریم
بە سەر چڵوچێوی تەنیاییەوە
شیتاڵ شیتاڵ دەبێتەوە
کە ڕەشایی شەو قەترە قەترە
لە دەمی دەمە و بەیانا دەتوێتە وە
بە نەزاکەتەوە دەڵێم:
بارانتر بدوێ.......هەوریلار
شڵپ و هووڕی ناو سێبەر
گۆرانی لە ناو خوێنا
چنینەوەی وردە شوشەی گریان
لەناو مێرگێکی سەرخۆشا
سەفەر بە ناو
برینە کانی تە نیایدا

ئەم سۆناتای گریانە
هە ر لەخۆت جوانە .... هەوریلار
بیرت نایە..؟
دە هاتین و  وەك چۆلەكەی كەسیرە كەوتوی ژێر باران
هەر خۆمان ئەكێشا بە پە نجەرە كانا؟!
دە هاتین و  نیوەی دڵمان
لە سە ر سفرە كەی دایكمان  بەجێهێشت و
نیوەكەی تریشی, هەرخوا ئە زانێ
لەم كێوی وەحشەتەداو  لەكام بنە بەردا
بە جێماوەو دە بێت بە بەرد
دە هاتین و لە ناو خۆڵەمێشی بێتاقەتیا  دەگەوزاین و
تە نیایی وەك سەگ تێمان بەربوبو
تۆزو گە ردی پێڵاوە كانت بتەكێنە
ئینجا دەرگای دۆزەخ بكەرەوە
دەرفەت بدە ........
با پەنجە گەورەی دەستم

پە شیمان بکەمەوە لەخۆکوشتن
ئینجا دێم و دەرگا لە باران دەکەمەوەو
پێی دەلێم:
ئە رێ بە راست ئەوەتەی دنیا هەیە تۆ دەبارێی
کە چی یەك گوناهی ڕەشت پێ سپی نەکرایەوە
خوێنت لە دەمی چەقۆیەك پێ نەسڕایەوە
فەقیانەی کچێکت نەکردەوە و تۆزێ لەگەڵیا نەگریایت
نەتتوانی ئەو پێناسەیەی عەشق ئەرشیف بکەی
کە دەڵێ:
عە شق ئاشتکردنەوەی مناڵێکە
کە لە نانخواردن دەتۆرێ
چاوی هەرچی گەڵا هەیە پڕتکرد لەفرمێسك
کەچی نازانم بۆچی خۆت گریان ناناسی؟!
مۆڵەت بدە ........
با پە نجەی شایەتومانم سەلامی نوێژەکەی بداتەوە
ئینجا پێت دەڵێم:

میلی کاتژمێرەکەت بوەستێنە
چونکە دڵنیابە هەمومان پیر دەبین
پیردەبین و دەنکێ ترێی گە نجێتیمان نەهاویشتە دەممانەوە
پیربوین و تۆزێ شرە ئاومان نەکرد
پیر بوین و سەرخەوێکمان نەشکان
لە ناو ئەو بێستانانەدا, کە یەك شەمامەیان نەگرت بۆ دەستی دۆستان
ئیدی بۆچی ئاوێزانی یەکتری بین .....هە وریلار
کە لوتم پڕدە بێ لەبۆنی دەربەدەری
کە ئاوابون بە سەر شانوملی ماڵەکەمدا, دائە چۆڕێ
کە, کەوشەکانی دایکم
بەخوێنەوە لەبازاڕ هەڕاج دەکرێ
ئیدی من هەردەگەڕێم و وێڵم بە دوای
کراسێکی ڕە ش بۆ هە وریلارو
چاوی بە جێماوم لە ناو کەوشەکانی دایکمداو
مانگی بە جێماوی سە فە رو
خودای بە جێماوی نێو ئەم دەربەدەریە

تۆ بڕوانە, متمانە چ خوێنێکی لێئەچۆڕێ؟

هە ر لە داچۆڕینی خوێنی

پەنجەکانی (حسە ین) ئەچێ لەکەربەلا

تەماشاکە .......

زەردەپەڕ لەم پیاڵەیەی نێو دەستمدا

چۆن داویەتیە پرمەی گریان؟!

هە ر لەبەیەکگەیشتنی من و تۆ دەچێ.... هە وریلار

تەماشاکە ........

تەرخون چۆن سەریناوەتە نێو کۆشی ئەو جۆگەلەیەوە و

تە زبێحێکی پچڕاوە لە وە فا ئەچنێتەوە؟

زۆر داوا ناکەم کراس هەوری

من سلاوی بەر لەخۆکوشتنم دەوێ, نەك گریانی دوای مەرگ

سلاوێك پێش پە شیمانبونەوە

سلاوێك بەر لەوەحشەتی عەشق و

تۆفانی بەیەکگەیشتن

داوای زۆر ناکەم

لەگەڵ خۆتا

نمێ بارانم بۆبێنە, پێش ئەوەی لە تینوانا بخنکێ

کوا داوای زۆرم لێکردوی ... هەوریلار؟

ئەوەندە غەریبم بەخۆم

چاوم جەسارەتی نیە

سە یری دەسبەتاڵی دەستەکانم بکات

وشکاوی هات ڕوانین لە چاوانما

نیوەی دەستم لەناو گۆزەیەکی شکاوی بەر بارانا

شکاوتر لە دڵم بە جێماوەو

نیوەکەی تریشی بە نیازە ئەم شەو بەدزی ئەستێرانە وە

مانگ کفن و دفن بکات

عیسا بە هەموو بزمارە داکوتراوەکانی لە شیەوە

لە دڵە خوساوەکەما جێی بوەوە

مەحوی بە تۆفانی ئەو هەموو ئاگرەوە

لە ناو بیبیلە کانما ڕاکشاوە

کەچی ئێستا

دە ستم بە کوژراویش لە ناو خوّما جێی نابێتە وە
ڕوّحم جێگای ئەو لاسکە ڕێحانەیەی تیا نابێتەوە
کە دوێنیٚ شەو  بەشایەدی هەورێك خوّی کوشت
دڵم هێندەی تاڵە موویەکی پێوە ماوە
ئیدی داوای چیم لێدەکەی...؟
ئیدی شەختە بەندی ئەم عەشقە
چوّن لەمنا سەوز دەبیٚ و
چوّن لەمنا جێی ئەبێتەوە.... هە وریلار
دە ست و پەنجەت  مەدەرە بەر ئەو ئاوە خوێناوییەی
کە لە ئاوابون دەچوّڕیٚ
چونکە لە سەرابا نەبێت
نە دەنگم دەگاتە گوێی توّو  نەدەتوانم
دەستوپە نجەت بدوێنم
توّ ئاگری دووری دەتسوتێنیٚ و
من قیامەتی بە یەککەیشتن دەمکاتە خوّڵەمێش
توّ سەر پەنجەکانت  نەرم نەرمن بوّ دەسبازی

منیش سەرپە نجە کانم بونەتە سوتو
دە ستم لێبدەی هەر دەوەرێم
دەستیشم لێنەدەی هەر دەبمە خوڵە مێش
دەبزانە چەن ترسناك لێك بزربوین..... هەوریلار؟
ئیدی تازە کەس دان نانێت بەمەرگی ناو ژورەکانا
ئێواران زەردەپەڕ لەگەڵ کەسدا ناچێتەوە بۆماڵە وە
چونکە دەڵێ:
من کە هەر دەبێ بمرم
با بە دەم فڕینە وە گیانم دەرچێ نەك لەناو ژورە کانا
منیش کەسێك نەماوە پێی بڵێم:
بە شەودا پڕدەبم لەباڵ بۆ فڕین و
لە ناو باخی گێلاسا دە تریقێمەوەو
چاوی گەلآی گێلاس ئەسڕم
کە بە یانی هەڵدەستم
قەتێیەك لەدەست میحنەتی فڕین هەلآتوەو
لە بە ردەم پەنجەرەکەما خۆی کوشتوە

چەند دەسڕەنگینی لەنەخشاندنی ئەم گۆزانەی سەر ڕێگادا
تاڵی ڕەش لەسەرتا نەما بەدیار سپیکردنەوەی گۆزەڵەکانە وە
کەچی سەرت بوو بەکلوی بەفر
بەلاّم گۆزەڵەکان سپی نەبونەوەو سپیش نابنە وە
تۆ عومرێکی درێژە گۆزە دروست دەکەی
بێئاگای لەوەی
چۆڕێ ئاو نەما دەمی بیابانی پێ تەڕبکەین
ئیدی چۆن گۆزەڵەکان پڕ بکەینەوە لە ئاو... هە وریلار؟
غوباری دار بیەکانی بابلم لە خۆم نەتەکاندوە
ڕۆحم لە دەمی سکڵەکانی پیربونا
تەماشاکە چۆن دەقرچێ!
تەماشاکە چۆن بیرت دەکەم!
نە دەتوانی دلۆپێ بارانی نور بپرژێنی بەڕۆحما
نە منیش دەتوانم دەست لە برینێکت بدەم
تەماشاکە دور لەیەکتر ...
چ جوانیە کی مەلولین ..... هەوریلار

ڕێگاکان نین
ڕێگاکان لە ئەزەلەوە نەبون
ڕێگاکان نابن، ئەگەر هەشبن
دەمبەنەوە سەر کوێرە ڕێی بەنبەست گەیشتوی ڕۆحم
تویێژاڵ تویێژاڵ ئەم – با–یە دائەتاشم
هێواش هێواش ئەم هەورانە ئەڕنم
کراسێك لەخوێن لەبەر ئەکەم تا بتوانم
گوێ لەدەنگی هەنسکێکی دڵی یەعقوب بگرم
توێ توێ برین لە لێوی ئەم ڕێگایانە دائەماڵم، تا بتوانم
گڵمتکێك لەجوانی بدزم و نەزیفی ئەم نیگەرانیەی پێ بوەستێنم
وانەی یەکەم مامۆستا ئاڕاستەی گشت –با–کانی بۆدیاریکردین
کەچی نەیتوانی ئاڕاستەی خوێنترین–با– دەست نیشان بکا
ئۆف جوگرافیا چ کراسێکی تەنگی بە بەری من
وانەی دووەم مامۆستای ماتماتیك
خشتەی لێکدانی گشت ژمارەکانی پێ لەبەرکردین
منیش پرسیم: ئەدی مامۆستا گریان کەرەتی تەنیایی یەکسانە بەچی؟

وای ماتماتیك چەند زەلیلی بەرامبەر پرسیارێکم
چەند غەریب و رموزمی بەرۆحی من
بە جوڵەیەکی نەبینراو دەست پێ ئەکەیت و ئەڕژێی بەسەر شەوا
وەك رژانی پۆلێ ئاونگ بەسەر گۆنانی دەشتێك رێحانەدا
بە جوانیەکی ترسناك دەست پێ ئەکەیت.
وەك جوانی ماچێکی نەپشکوتو
وەك جوانیەکی شەوەکیەکی دەستنوێژ نەشکاو بە روناکی
وەك جوانی ماچێکی دەم بە ویردی سەر بەردە نوێژی خەیاڵ
وەك جوانی یەکەم ختورەی فڕین لای زەڕنەقوتەیەك
ئاوا دەست پێ ئەکەیت ئەی–با–
لەهیچ ئاشکرابونێك ناپرسم
لەهیچ فرێنیك ناپرسم
لەهیچ خودایەك ناپرسم
لەهیچ مردنێك ناپرسم
کە مردن هێندە ناسك بێت و بەرگەی دەست لێدان نەگرێت ئیدی بۆچی پرسم؟

ببورن تەنیا دەمەوێت لە نەزیفی خوێنی –با–بپرسم
چونکە کەس پێی نازانێ و نایبنێ
شەوانە –با– چەندە خوێنی لێئەچۆڕێ
تەنیا من دەزانم و دەیبینم
هەموو شەوێ –با–ئەوەندە بەسەر ئەوا دەگری
تا هەموو شانوملی بەخوێن تەڕ ئەکا
من دەزانم لورە لوری شەوانت چ گریانێکی کەسکونە
بەس نازانم بۆچی ئەبێ هەمیشە
گریانی کەسکون و دڵتاوێن بکەوێتە شەوەوە؟
ئەی –با– چەندە لەدایکم ئەچی لەبێ ڕەنگیا
ئەی –با– تۆو دایکم هیچ بونتان نییە
کەچی سەرلەبەر ژیانتان داگیرکردووە....!
کە ڕێگایەك بترسێ لەونبونی خۆی
چۆن منێکی موبتەلا دەگەیەنێتە مەنزڵی –با–؟
سەختە دۆزینەوەی ڕێگایەك بمباتەوە ماڵی –با–
وەك سەختی و دوری ڕێگای ناو شارە هەناریێك

پێش ئەوەی داوەرێنرێت و پژان پژان بکرێت
دۆزینەوەی ڕێگایەك بۆ ماڵی –با– سەختره
له سڕینی فرمێسکی رومەتی سێوێك
کەغەریبی لایەکی سورکردوەو ئێمەش ناومان لێناوه
سێوه لاسورەی سەر زەمین
له ئەزەلەوه هەڵەبوم
چونکه بەدوای ڕێگادا دەگەڕام
دەرنگ تێگەیشتم
ژیان ماڵێکه له لم
لەناو لمدا کەی گوڵی ڕێگا شکۆفه دەکات...؟!
ئەی–با– توڕەبونەکانت ئەدەی به ئێمەو
گۆرانیەکانت گۆڵەکانی پێدەخەیته سەما
ماڵی هەموومان پیێ دەزانی
کەچی ماڵی خۆت تەنیاپیشانی چەمەنزارو ئاوەکان ئەدەی
من دەزانم تۆ دڵشکاوو تۆراوی
دڵت شکا لەیەکەم دەست درێژی مرۆڤ بۆ سەرجوانی

رۆحت تۆرا لە ئێمە، چونکە نەمان پرسی
خوارەی ئەم خوێنە لەقولآیی کام برینتەوە هەڵئەقوڵێ ئەی با
ئیدی تازە بەم درەنگ وەختە
گریان ریاییەکی بێ لەزەتی دوای مردنە
روانین بۆ باران لەپشت پەنجەرەوە
رۆمانسیەتێکی پووچە
ئێمە دەمێکەو ئێستاشی لەگەڵدابێ
لەدڵەوە گۆرانی ناڵێن و وەتەرەکانە رۆحمان نالەرزێنین
ئەوەی ئەیلەرزێنین لێومانە نەك وەتەرەکانی رۆحمان
مردن هەرگیز شەقاوێکی رۆیشتن پێ نەوەستاندووین
مردن ئەوەندە راینەچڵەکاندین تا بچین
دڵی شکاوی هاوسێکانمان ئاشت بکەینەوە
ئێمە بۆیە درندەین، چونکە مەخلوقێکی لەبیرکەرین
کەهەموو شتێکمان لەبیرکردبێت بەمەفهومەکانی پشت مردنیشەوە
ئیدی چۆن گریان رێیاییەکی بێ لەزەت نییە؟
لەپشت پەنجەرەوە کەی دەست لەدڵی باران ئەدرێت؟

باران ئەو ڕێگا دورەی بڕیوە کەچی ئێمە
تەڕبون دەترسین و لەژێر چەترو لەپشت پەنجەرەوە
باس لەسیحری باران دەکەین
هەمیشە ئەوەمان لەبیر دەچێتەوە، کەهاوسەفەری ئەو ڕێگا دورەی باران
با–یە–با–نەك مرۆڤ
لەناو ڕۆحی ئەو هەرێزانەی ئنسان دەستیان پیۨ ڕاناگا
پڵنگێك خەوی لێکەوتوە
لەناو چاوی غەفرەدەی نێرگزەکانی جەهەنەما
–با–جارجارە پێدەکەنیۨ و جارجارەش پەنجەی پەشیمانی دەگەزیۨ
ئەی –با–
ئەی پەیکی دڵۨ پڕ لەخوێناو
تۆ ئاگرێکی بەویقارو من پەروانەیەکی ترسنۆك
تۆ تەنیاییەکی پڕ هەیبەتیت و منیش قەرەباڵغیەکم
پڕ لەسەر گەردانی
تۆ ئاگرێکی پڕ قسەیت و لەشەودا نەبێت هەڵناکەی
ئەی دۆستی گشت بیۨ دۆستەکان

دە لەناو خوێنما هەڵبکەو لرفەت بێت، تابتوانم
ئەشکی گەرمی قومریەکی دڵشکاو هەست پێبکەم
ڕێگەم بدە تا خۆم کۆبکەمەوە
ڕێگام بدە ئەم کاسە درزبردوە پڕ لەخوێن و پڕ زوخاوە
کۆبکەمەوە کە دڵمە
هەی هات چەندە لەت لەتە ماڵی دڵ
بە دەزولەی کام قەتارە بارانا
بچمەوە سەر یەکەمین دیداری فرمێسك لەگەڵ چاوا
کەنەتوانم دەرگای قەفەرێك بترازێنم بۆ کەناریەك
چۆن دەتوان خۆم بدەمە بەر لرفە لرفی خوێنی –با–
کەی دەوێرم
دەست بخەمە سەر تەوێڵی نیوە شەوێکی مەلول و تۆراو
کاتێك –با– بەتۆڕەبونێکی جوان، شەلاڵی عارەقی دەکات
سەدای گریانی ئەم –با–یە
دەنگی بەگوێی خۆم نەبێت ناگاتە گوێی کەسی دیکە
بەفرێکی ترسناك لەدەستما باریوە

یان ئاگر یان لێدزیوم، یان ئەمە یەکەمجارە بەفر بەراستی ببارێ
دەستم پڕە لە ئێوارەو
ئەم شەقامە جگە لەخواو چۆڵەوانی، کەسی پێوە نەماوە
ئەم چاوەڕوانیەم بۆ گەڕانەوەی حەزرەتی —با—
وەك چاوەڕوانی ژنێکی لەئەنفال بەجێماو وایە
وەك چاوەڕوانی گۆزەیەك وایە لەسەر کانیەکی کوژراوا
وەك چاوەڕوانی ئەم مەخلوقە وایە بەدیار هاتنی
پێغەمبەرێکی دی و وەحیەکی دیکەوە
ئەم لێو کرۆژاندنەم بەم تەنگی نوێژی شێوانە خوا چاکی بکا!
دڵم باش ناڵێ، هەی هات چەندە لەت لەتە ماڵی دڵ
ئەی —با—
بەقەدەر تۆڕەیی تۆ لە خودا
تۆڕەم لە ئەو
ئەی —با—ئەی جەهەنەمترین خولیاو برینداترین عیشوە
ئەی جوانترین تۆڕەبوون لەکاتی مەرگی گەڵادا
لەهەموو شوێنێك هەیت تەنیا لەناو مندا نەبێت

PDF 4 KURD

مەگەر لەناوچاوی چۆلەکەکانی بەر بارانا دەستگیرت بکەم
ئەی –با–
تۆ سێبەرێکی کەلەلاو بزەیەکی خوێن تێزاوی
نوێژێکی فەرامۆشکراوی ناو مزگەوتێکی روخاوی
بیرەوەریەکی بریندار و وشك هەلاّتوی بە ئەڵقەڕێزی دەگاکەمەوە
دڵم پڕە لەمناڵی و چاوم پڕە لە گریان
دەستم پڕە لە ژنەکەم و قوڕگم پڕە لەهەنسکی ئایندەی مناڵەکەم
هەموو خۆم خەڵتانی برینێکە
کەتازە زەحمەتە بتوانم تەفسیری بکەم
هەموو ویژدانی من ناتوانێ لەگەردوگوڵی بەیانا
گرێی دڵتەنگی گوڵە شەوبۆیەك بکاتەوە
تازە دەبێ تا قیامەت
–با–بە نەزیفی خوێنەوە سەر بنێتەوەو
خوێنیش هەر تەرمی –با– تیایدا هەڵکا
روکەمە کوێ ئەی کەسی بێ کەسان، ئەی نا ئومێدی
دە پێم بڵێ تازە بەم درەنگ وەختە روکەمە کوێ؟

گوڵێك بە خەیاڵی قەمورەوە
لە تەکانی دەریا کۆدەکاتەوە .
کێلونێك مەفتونی ناو زەریا شینەکانی ئاسمانە و
گەرەکیەتی مەعنایەك بۆ دەریا بدۆزێتەوە
ئەی پەنجەرە قەترانیەکانی سەرمەدی
فریوتان دام بە وەحشەتەکانی ئازادی
چونکە فێرتان کردم کە چۆن هەڵبێم
بۆچی دەتانەویٚ وەك ئێوە پیٚ بگرم
ئێوە وەچەی شەریعەتێکی زۆڵن
ئێوە پێتانگرد ، بۆ ئەوەی
گوڵەکان گورگان خواردوو بکەن
پێتان گرت و هەڵهاتن
نەوەستان تا
پەلکیٚ پونگە بە قومیٚ ئاو دەمی تەڕکا
هەلٚ هاتن و ئەو هەموو ماسیەتان ، بە تۆڕەکانەوە جێهێشت

هەڵهاتن و جەنازەی ئەو هەموو ئیمانەتان
ڕوت و عوریان , لەم سەحرایەدا بەجێهێشت
دوا پێکی مەستیتان هەڵدا و هەڵهاتن
کە پێتانگرت
مۆڵەتان نەدا , کاژیلەیەك پێبگرێ و سەر تان بڕی
ئیدی بۆچی پیێ بگرم ؟
کە پێگرتن بۆ هەلاٚتن بێت لە دەست
وەجدی دوو هەرمێ و نوێژی ڕێواسێك
کە تا مرد , سوجدەی نەبرد
ئاوا دەڕژا خەیاڵی خۆڵێ......

مەحشەرە ئەم ختورەیە
قیامەتە ئەم خەیاڵە
مردنێکی نازەنینە , بریندار بونی ڕومەتی ئاو
دایکم دەست و پەنجەی ئەو دڵۆپە بارانانەی دەگوشی
کە بەڕوتی لەسەر پێڵوی تەڕی پەنجەرەکەم

خەویان لێکەوتبو
کچێك گرێی فەقیانەکەی دەترازاند و
بە دەم ڕێگاوە هەوری لێ ئەڕژا
هەرزاڵێك بە قەدپاڵی داڵغەیەکەوە
نینۆکی نیگەرانی دەکرۆژی
قۆریەك بانگی ئێوارەی تێدا دەکوڵێ
تەزبیحێك , وەڕس بووە
لەم هەموو دەنك دەنك و ژماردن و ئەمدیوا و دیوکردنە
ئاوا دەڕژا خەیاڵی خۆڵ........

زەحمەتە چنینەوەی دەنکە مرواریەکانی خۆڵ
لەکاتی نوێژی شێوانا
وای کەسەختە بەرماڵێ بەبێ ئەدرەس
ڕەوانەی ناو زەریای بکەی
سەختە هەڵگۆزینی حیکمەتەکانی بێ دەنگی
لە ناو قوڕگی وشکی خۆڵا

زەحمەتە لە شۆکی مەرگ ڕزگارمان بێت
ئەگەر نەزانین تریێ چۆن سەر دەبڕڕیێ و
شەرابی لێدروست دەکریێ
زەحمەتە لە عیشوەی باخ تیێ بگەین
ئەگەر کلاوەکانمان پڕ نەبووبیێ لە گەڵای وەریوی هەنار
کیێ دەزانیێ ئێمە بۆچی زوو دەمرین
من پیێتان دەڵێم , چونکە
ناوێرین لە ناو ئاگردا سەما بکەین
ئێوارەیەکم لە ئێوارە ناوەختەکانی خۆت بدەریێ
تابتوانم بەردی تیا ئاشت بکەمەوە
بەیانیەکم لە بەیانیە دەست نویێژ نەشکاوەکانی خۆت بدەریێ
تابتوانم جەنازەی حورمەتی تیا بشارمەوە
لەپە دەستیێ لە ڕوانینم بدەریێ
تابتوانم چاومی تیا کفن و دفن بکەم
ئاوا دەڕژا خەیاڵی خۆڵ ......
خودایە خۆ من مەخلوقی خۆت بوم

بەم دەست بەتاڵیە و لەم سەحرا کفن پۆشەدا
بۆ جێتهێشتم !
بۆ پڕت کردم لە نەوای ئەم هەموو چەقۆیە !
من کە خاڵی خاڵی بم لە زیوی وەفا
کەی دەوێرم جەنگی بریسکە بریسکی شمشێر بکەم !
کە ڕژانی ئەو هەموو ئەستێرەیە ڕامنەچڵەکێنیٚ لە خەودا
ئیدی کەی دەوێرم
تەماشای شەو بکەم بە ڕوتوقوتی لە ئاوێنەی چەمێکا !
خودایە بۆ پڕت کردم , لەم هەموو بیٚ ویژدانییە !
مرواریەکانی ئاوایی
وەکو (بی) ناو ئاو دەلەرزن لە سەرمادا
چۆلەکەکان باران باڵی شکاندون
کەچی من لە ژورەوە . تادیٚ
قوڵتر نەفەس لە سیگارەکەم ئەدەم
دەخیلت بم کە بینت نا بە ژیانەوە
چۆڕ بڕی نەکەی

لەبەر من نا . لەبەر خوا
چونکە ژیان بەخوداوە جوانە
کەبینت نا . بە مەرگەوە
دەخیلت بم تەڕایی بڕی نەکەی
چونکە منداڵەکەم لەوسەری زەمەنەوە
سەرەی گرتووە بۆ قومێ مەرگ
ئاو بەم حەپەساوییە , بەسەر مانا جێ مەهێڵە
نەدەتوانم لێی بدوێم و
نە دەشوێرم , بەدیاریەوە هەڵبکورمێم
خواردنەوەی شەو , هەر بەمەستی لەزەت بەخشە
جێم مەهێڵە , دەخیلت بم
بەرگەی ڕەهێڵەی ئەم تاریکییە ناگرم
ئەم سەفەرە تولانییە , بەناو حەپەسانی شەودا
قاقای ئەم پێکەنینە ژەهراوییە
هەرچی چاوەڕوانی هەیە تیاما هەڵی گۆزی و چۆڕ بڕی کرد
ترسناکی قەرەباڵغی ئەم مەخلوقە لەعینە

لە پێیان خستوم و
منیش پێیەکانم بەخشی بە دەریا
دەریاش لە نێوان مەرگ و سەفەردا دۆشداماوە
نازانێ کامیان هەڵبژێرێ
ئاوا ئەڕژا خەیاڵی خۆڵ......

چ دڵنشینە ئەم وەجدە
کە مەولانا گەرد و تۆزی لە شانی ئەتەکاند
چنگێ خۆڵ لە شارەزور دائەچڵەکی
خەیاڵێك لە نوێژدا ئەبورایەوە
بەهێیەك چەمێکی ئەپەڕاندەوە و
زەردەپەڕی هەڵئەگۆزی
کە مەولانا تۆزی غەریبی لە برژانگی ئەوەراند
خۆڵ خەیاڵتر لە خەیاڵ
ئەستێرەی کوژراوی کۆئەکردەوە

چ دڵنشینە ئەم مەلولیە
ئەم هەمو مرواری گریانە
فرمێسکی خۆڵە و ئێمە نایبینین
ئێمە پێمان گرت بۆ ئەوەی پێ بنێین بە چاوی خۆڵا
ئێمە بەد مەست بوین شەقمان هەڵدا
لە ویقاری ئەو هەمو بێ دەنگییەی خۆڵ
من هەڵنایەم.....
چونکە نامەوێ خودا بە تەنیا جێ بهێڵم
حەپەسانی من بە دیار
هەڵات هەڵاتی ئەم مەخلوقە بێ ئینسافە
کە نازانن لە چی هەڵدێن
دۆشدامانی من بە دیار , ژاوەژاوی ئەم گەوجێتییەوە
لە پێی خستوم
ئاوا ئەڕژا خەیاڵی خۆڵ.......

چ دڵ نشینە ئەم ماڵە بێ دەرگایە

باڵە خانەیەکی جوانە , ئەم سەرابە
ئەگەر نەعنا هەبێ بیخۆین
دەخیلتانبم , کەزاکیرەی دلۆپێ بارانم لێ ونبوبێ
زەحمەتە لە گێژەنەی ئەم شەپۆلانەی دەریادا
هیچ حاسڵ کەم
خەیاڵتر لە خەیاڵی دلۆپێ بارانی ونبوو
ڕۆ ئەچمە ناو
گریانی گەروی دەنکێك هەنارەوە
خۆڵ و غوباری سەر گەڵای ئەو هەنارانە مەشە میزێنن
ئەی نازانن
من دڵم لای سەحرایە و
ڕۆحیشم هەر لەلای هەنارەکان جێ هێشتوە
ئاوا ئەدوا خەیاڵی خۆڵ......

وای چەندە بێ مەعنایە
ژەنینی بلوێر لە سەحرادا , بەتایبەت ئەگەر خۆڵ مەست بێت

ئەی خۆڵ......

لەکام کاسەیان شەرابت تێکردوە

واهێندە مەستی , خوا ئەدرەوشێتەوە تیاتا

چ وەحشەتێکە یاران

زاکیرەی خۆڵ لەماڵی – با – دا نەبێ

ساکن نابێ

– با – چاوی پڕ نەبێ لە خۆڵ

نەرمە ئارەقی تەوێڵی گوڵێکی سەحرایی پێ ناسڕێ

چ وەحشەتێکە یاران

گوڵ لە باخچە بفرێنی و سەری بڕی و

بە دیاری بینێری بۆ یار......

ئەی خۆڵ فێرت کردم

هێندە بە قولأیی قەلأییەکانا ڕۆچم

هێندەی نەماوە , دەستم بەر دڵم بکەوێ

هێندەی نەماوە , دەستم

بەر گۆی مەمکی دەریا بکەوێ

وای دەریا خیانەتێکی گەورەت کرد لە باران
ئەو هات بۆ ماڵی تۆ کەچی تۆ کردت بە ئاو , باران بونت لیٚ سەندەوە
وا خەریکە پێئەنێمە ناو وەجدی
دوو دەنك هەڵوژەی مەئیوسەوە
واخەریکە دەستم بەر غروری پرتەقاڵیٚ دەکەویٚ
وا خەریکە دەم ئەنێم بە ڕومەتی
هەنارێکی دەموپل خوێناوییەوە.

باڵێك خۆی لەبرینی ئاسمان دەسویٚ و
خوێناوی دەبێت, ئینجا دەزانیٚ
فڕین بەخوێنەوە جوانە
نیوەڕۆ, بەدڵی پڕ لەئەسەفەوە
لەبەردەم فوارەی مزگەوتەکەدا بورایەوە
کەچی مامۆستا بەو پەڕی نەزاکەتەوە
لەمیحرابەکەی خۆیدا
جەنازەی ئیمانی کفن و دفن دەکرد
لەناو مەزراکان, ڕێشۆڵەی کوژراو
خەون بەفڕینەوە دەبینێت
لەناو تاقی پەنجەرەکانا
دایکم بۆ کلیل دەگەڕیٚ, تا دەرگاکانی سەرابی پیٚ بکاتەوە
لەناو بیەکانا,
تەنیایی بەو هەموو هەیبەتەی خۆیەوە دەلەرزیٚ
سەر بەکۆشی کام حەقیقەتا دەکەی...؟!
ئەی نازانی...

ئێمە هەموومان ماڵمان هەیە, کەچی لەبەردەرگا دادەنیشین
زرنگەی دێ پاوانەکانی پێی یارو
شکۆفەی دێ برینەکانی سەر دڵم
ئەڕەقسێ قوڵپی گریانم
بەسەر پشکۆی ئەم برینە تەڕەوە, کەخاوکەرە
خاوکەر قیامەتە, لەناو قوڕگا
خاوکەر گەردەلولە, لەناو خوێنی ڕژاوی پایزا
خاوکەر لەچکەی ژنێکەو
خوا دەمولوتی خۆی پێ هەڵبەستووە
تا چیتر بۆگەنی ژیان هەڵنەمژێ
سەبرتر لەسەبری ئەیوب
سەبرتر لەمەرگی خۆڵەمێش
نەرمتر لەگلەیی کوزەڵە, لەگوێی چەمێکی جێماوا....
بۆنخۆشتر لەبۆنی سەمونی بەیانیان
دڵتەنگتر و بێکەستر لەو خاوکەرانەی
لەبنی کانیەکانی (گەرمیان) دا بەجێمان

دەخيلت بم لێگەڕێ

ئەم ڕێگایە هەربەتەنیا دڵئاوەرە

لێمگەڕێ, با ئەم ئێوارە

بەتەنیا بڕۆم ڕێحانەکانی دایکم ئاو بدەم

سپی... خودا یان دایکم

باران....

خۆم یان منداڵەکەم

هەور....

دڵم یان دڵم

کاسەیەك بەخوێنەوە ڕەوانەی ناو دەریای بکەو

سوێند بەجوانی ئاو بخۆ

چەمێك بپەڕێنەرەوە ئەوبەر دەشتی دڵنیایی و

لەگەڵ دەمەشێرە دەموپل خوێناویەکانا

رەسمێکی بگرە بۆیادگاری

منیش لێرەوەیە بەهەردوو دەستم دەبنە سوتو

بەدیار خنکانی پەلکی رازیانەوە

ئەو دەمانە ئیدی
سەرم سورِ دەمیّ لەوەی
ئاو بۆچی قەت ناخەویّ؟
باران بۆچی, کە ملی نا, هەرگیز ناگەڕێتەوە؟
چوالە بۆچی, هەتا خۆی سورنەکا لەخوێن
گولّ ناگریّ؟
سەیرە....!
بۆچی هەمیشە دایکم, لەبانگی ئێوارەدا
توشی دلّەکوتیّ دەبێت و
دەنکی تەزبێحەکەی خێراتر دەجولّێنیّ؟!
سەیرە.... ئێجگار سەیرە
مەرگی کەسێك نامگرییێنیّ
کەچی کە گویّ لەخاوکەریّ دەگرم
دلّم دەبێتە مەحشەری گریان
دلّم هێلانەی مەستانە
وەلیّ تەنیا خاوکەر

بەمەستی رێی دەکەوێتەوە ماڵی دڵ
جاران خودا, لەسەر میلۆدی خاوکەر
وەحی دەنارد بۆ سولەیمان
بۆیە باخەکانی وی
تژی بوون لەبێستانی پڕ شەمامە
وەلێ ئێستا
خودا, لەسەر ئاسەواری قوببەی مزگەوتێکی روخاو
دانیشتووەو دەڵێ
ئەو هەموو ساڵە, تەنیایی پیری نەکردم
کەچی لەو رۆژەوەی, تەراتیلەکانی خاوکەرم لێ ونبووە
زمانم چۆتە کلیلەو گۆرانیم لەبیر چۆتەوە
نزایەك لەدڵما سەوز ئەبێ
ئاوێك لەقولاییا
سەر ئەکا بەکۆشی خۆلا
شەو لەدەستما نوستووەو
بارن لەناو میلۆدی ئەم خاوکەرەدا, هەدادانی نیە

دەشتی وەحشەت بەرەوالأیەو
برینی ئەم ئاوابوونە تەڕ تەڕە
وەك دەستی دوعای نوێژێکی بەجێماو
تۆ دەڵێ شکستە باڵم
من دەڵێم نەفرەتت لێبێت, ئەی فڕین
تۆ دەڵێی
ئاسمانێکی ساماڵ جوانە, بۆ خەم بەباکردن
منیش دەڵێم
سەحرایەك بۆڕوانین خراپ نی‌یە
تۆ لەناو قامەتی ڕەنگا ئەدرەوشێیتەوەو
بێ ئاگای لەوەی
تەجەللای تاریکی چ کۆشکێکی ئەفسونگەرە
من, لەپێی کۆڵأنەکانی دوکەڵا
بەدوای درەوشانەوەی مۆمێکی ونبودا وێڵم
ئەزیزەکەم, بەرەوکوێی دەئاژوی
ئەم کەشتیە پڕ دوکەڵە

ئەی نابینی ئێوارە, بەدەست بەتاڵی دانیشتووەو
ئاوابوون قسەیەکی پێ نییە, بۆبەیانی
ئەزیزەکەم پێی ناوێ
ئەمپەڕاو پەڕکردنی دنیا
تۆ لەودوورەوە سیگارێ رۆشن بکەو
منیش لەم سەری دنیاوە
دوکەڵ دەکەمە چاوساغ و
سۆراغی برینەکانی خاوکەر دەکەم.
هەر دەڕۆیت و پەلەپیتکەی ئەم ختورەیەت
ئێوارانم خوێناویتر دەکات
وەنەوزی ئەم کۆترانە
تارمایی مەرگم لەلا تۆختر دەکاتەوە, یاران
شلوێ بوونی غایەڵەی ئەم بێ تاقەتیە
نایەڵێ سوتوی جگەرەکەم هەڵگرمەوەو قومێ لەخۆم بدەم
کەلەبنی پیاڵەکەما بەجێ ماوە
برینی بای بەیانیان و سێبەری بەجێماوی تەوێڵی تەڕی دایکم

بەبەردە نوێژەکەوە
سایەی ئەو گوڵە حاجیلانەی, تامردن
دەستیان بەر جوانی شەو نەکەوت
گمەی جێماوی ئەو کۆترەی
لەدەست خوا رایکردو خۆی کوشت
سەربوردەی ئەو دڵتەنگیانەی
هەمیشە سەرە داوەکانیانم لێ دەئاڵۆزێ
خرمە خرمی دوگەلاَ, لەتەنەکەیەکی خۆڵاَ
سەرەتایەکی کوشندەن
بۆ لەیەکترازانی هێڵەکانی قسەکردن
ئەفسوس دەفتەرێکم لێ ونبوو
بۆنی غەریبی دەریای لێ دەهات
کتێبێکیان لێ فڕاندم
تاڵێ قژی دایکم و پڕ بەرچنەی مناڵێ
ئیمانم تیا هەڵگرتبوو

ئەفسوس.........
سورەتێکی نەنوسراوی و
لەدڵی خۆڵا نەبێت, ساکن نابیت
لەنیگای سەرابێکی پەژموردەدا نەبیٚ ناڕوانیت
ئایەتێکی لەبیرکراوی و
رێبوارەکانی رێگای دۆزەخ نەبێت
کەس ناتلێتەوەو ئەزبەرت ناکا
تۆهەرتەنیا لەخۆت ئەچیت ...ئەی خاوکەر
تۆلەخۆت و لەدڵم ئەچیت
تۆ لەئاو و لەچاوم ئەچیت
تۆ لەخۆڵ و لەقوڕگم ئەچیت
ئیدی هەر هێندەم ماوە, بڵێم
کەدیوار ئەڕمیٚ بەسەر ڕەنگا
کەگریان ئەڕوخیٚ بەسەر دڵا
کەگۆرانی لەناو وەجدا فەنا ئەبیٚ
کەبرین تەڕتر دەبیٚ لەخوێنی پرتەقاڵیٚ

کەخاوکەر قوڵپ ئەدا

لەپیێچەکانی (ئای....ئای) یا

ئەو دەمانە برینی تەنیایی دەڵیٚ

خوێنم لیٚ ئەچۆڕیٚ یاران

ئەو دەمانە

برینی تەنیایی دەڵیٚ:

ئەگەر مۆڵەت هەبوو دەڵێم:

تەڕترە لەخاوکەر ئەم برینە.

*خاوکەر: جۆرێکە لەمەقام تایبەتە بەناوچەی گەرمیان.

که یوسف بەربوەوە
دەریا، لە تاریکیدا داچڵەکی و لێوی هەڵزڵەپی
کە خڕکە بەردێکت لە جێگای دڵت دانا بێت
جەنگی جەهەننەمی عەشقت چۆن پێدەکرێت
پیاوە سەنگ دڵەکانی دنیا
کەی دەوێرن توخنی عەشق بکەون
من بە ڕژانی هەمو شتێ دڵم دائەخورپێ
بەتایبەت ڕژانی سێبەر
من بە ڕوخانی هەمو شتێ گیانم وەك شۆڕە بی دەلەرزێ
بەتایبەت ڕوخانی غرور
من بە شکانی هەمو شتێ ڕەنگم هەڵئەبزڕکێ
بەتایبەت شکانی مانگ
بمشکێنە وەك چاوی شکاوی، مینا ڕەنگی گۆمی ورمێ
بمشکێنە و ورد وردم کە
کە نەتوانم فرمێسکی بیزایەك بسڕم

من هەر بۆ جێهێشتن باشم
ئەو هەموە ستایشی بارانم کرد
کەچی جێی لەپێ دەستی نەدامێ تیا بسرەوم
دایکم هێندە بەکوڵ دەگری
مەگەر گریانی دێیەکی دوای ئەنفال
تامی گریانی دایکم با
بیکە بە خاتری ئەو بەرخەی لە ڕان جێما و کەس نازانێ خوا چیکرد بەنسیبی
پێش ئەوەی جێمبهێڵی
سەیرێکی ئەو لۆچانەی دەموچاوم بکە
هەر لۆچێکیان حیکایەتی گۆڕستانێکی غەریبی لە خۆیا هەڵگرتوە
داڵغەی ئەو پرتەقاڵە مەشەمزێنە
ئەڵێی مەمکی خوشکەکەمە
کە ئەیگوشی دڵۆپ دڵۆپ پەشیمانی لێئەچۆڕێ
ڕێیان نەدام تۆزێ بە گوێی خەیاڵ بکەم
بۆیە بەرەو تاڵترین ڕێگا ملم نا
بەرەو بێشەرەفترین لۆژیك پێمهەڵگرت

چوم بۆ ناو زەمهەریرێ، پێیان دەوت حەقیقەت
چ سەخیفە حەقیقەت فێرم دەکات
هەرگیز بیر لە برسێتی زەرنەقوتەیەك نەکەمەوە
لە کلۆرە دارێکی فەرامۆش کراوە
چ سەخیفە حەقیقەت
گشت برادەرەکانمی کردە
ژمارەی تەلەفۆنی بەر باخەڵ و
دایکم لەگەڵ شتنی کراسەکەمدا جوان خوساندی
ئێستا، بە ڕەقەمیش کەسیان ناناسمەوە
با خێرا تر لەگەڵ ڕەنگی زیوینی ئەم بەیانیەدا
کە هەر دەڵێی ڕومەتی چەمێکی تەفرە نەخواردوە، بە ژیان
دوا چۆڕی شەو، کە لە بنی پیاڵەکەما بە جێماوە بیخۆمەوە
بۆ لای کێی ببەم ئەم دڵتەنگیە....؟
بۆ کێی یەکالأکەمەوە ئەم ڕۆحە بیمارەم....؟
کە تۆ جورئەتی ئەوەت نەبێ
بچێتە ناو ڕەحمی ئاگرەوە

باسی سوتانی چیت بۆ بکەم؟
ئەم هەمو بێئیمانیە بوێرم بۆ کێی باس بکەم؟
خودایە ڕێگەم بدە، دەستت لێبدەم
ڕێگەم بدە، ماوەی تکانی تنۆکێ خوێنی ڕیشۆڵەیەك
بۆ بەر پێی ڕێبوارێکی بێویژدان
هەر ئەوەندە ماوەم بدە
گفتوگۆت کەم و پێتبڵێم
ئەم مەخلوقانەت بۆ بەرەڵاو سەرگەردان جێهێشتوە؟
لەسەر کێوی تور و ئەشکەوتی حەڕاو
لە کێوی عەرەفاتا قسەت کرد
تەنیا لەسەر کێوی نائومێدی ئێمە زمان نایەی
لێم قبوڵکە پێتبڵێم:
دەمێکە قسەت نەکردوە
دەبوا قسەت بکردایە
دەزانم ئەو ڕۆژە، نەفرەتت لێکردین
کە ژیانت پێبەخشین

من چۆن ڕوم بێت باسی عەشقت بۆ بکەم
ئەوەتا خوێنی مارە تەلاّییەکان
هێشتا وشك نەبونەتەوە، بە لێواری دەستمەوە
لەسەر ئەم تەختە ڕەشەی پێیدەڵن بیابان چی بنوسم؟
کە نوسین ئیفلیجترین ڕاپسکانە، لە دەست مردن
هاوار......هاوار......
موبتەلام بە دوی حەرفێکا هەیبەتی مردنی تیا باس بکەم
بێدەنگتر لە گریان وەرە
زەلیلتر لەبەرد جێمبێڵە
من و تۆ درۆیەکین یەك لەیەکتری شاراوە
من و تۆ سەرابێکین
هیچمان بە خنکانی ئەوی دیکەمان نازانین
من و تۆ کرمێکین، جەهلی پێکەنین نایەڵێ
زەرڕەیەك لە جوانی دارستان حاڵی ببین
من و تۆ دو مەلعونین
مەگەر پیرێتی بیرمان بخاتەوە و ناچارمان کا

دو دڵۆپ فرمێسك، لە دڵەوە هەڵڕێژین
ئەو مێخەکە، لە ناو دەستتا ورد مەکە
بۆنی دەستت خۆش نابێت
بەچی بۆنی دەستت خۆشبیٚ
ئەوەتا سێبەری گشت پەنجەکانت
لەناو خوێنی ڕژاوی گوڵاڵە سورەکانا، بە جێماوە
تۆزیٚ سملّی بەرباخەڵی دایکم چۆن دەتوانیٚ
بۆگەن و بۆساری ئەم جەنازەیە ببڕیٚ
کەپێی دەڵێن ژیان
دەستم لە ناو خوێنێکی ڕژاوا جێمابو
خوێنی بەفر بو وابزانم
چاوم لە دوا تەڕایی گۆزەیەکا لێونبو
کەچی هیچم حاسڵ نەکرد
پەڕی جێماوی ڕیشۆڵەکانم
لەژێرپێی ڕێبوارەکانا چنیەوە
کەچی ئەم ئاوا بونە، شتێکی پێنەوتم کە دەبوا پێی بوتمایە

بۆ بریندارى دەکەیت ئەم ناریکیە؟
بۆ بزانم قەتێ ڕۆژى چەند جار
قورگى پڕ ئەبێت لەگریان
بۆ بزانم منداڵە عەجولەکەى دراوسێمان
چۆن دڵى قومرى ئەشکێنێ و سەرى پێهەڵئەگرێ؟
ئەو پەنجەرە قەترانیە مەکەرەوە
بەچى ئەچێ و بۆ بیبینم؟
ژیان بە قۆڵبەسراوى لە بەردەم پەنجەرەکەمدا
گوڵە خەزێمێکى پیر، پیرتر لەم بێتاقەتیەى من
بۆ بزانم؟ لە کەیەوە ئەشکى ئەسەف هەڵئەڕێژێ
ژمارەى شکانەکانى دڵى . بـــا . بۆ بزانم؟
ئەم ڕستانە پڕ پڕن لە فرمان
فرمانى ڕاوکردنى گەلا
ئەم ڕستانە خالى خالێن لە ئاوەڵناو
هیچ نەماوە سیفەتى جوانى بدەینە پالْ
ئەم حەرفانە لە مێژەوە، نەدراونەتە پالْ یەکترى و

وشەی . ئـــاو یان پێنانوسرێ
بۆیە گشتیان بە پێوە، زەرد هەڵگەڕاون لە تینوانا
دەستمان برد بۆ خەیاڵی ئاوو شەمزاندمان
جاهیلانە، لە لافاو تورە بوین و بارانمان ئاشت نەکردەوە
تۆوی گوڵەکانی متمانەمان، لە دەشتی ڕەشەبادا چاند
بێباکانە هەنسکی خوێناوی کانیەکانمان
بەبێکەسی لە بنی دەریادا جێهێشت
ئەم سکونەت بۆ شەمزاند؟
ئەم ئاگرەت بۆ سەوز کرد؟
من دەمێك بو ڕەنگی ئاگرم بیر چوبوەوە
ئەم دڵنیاییەت بۆ دایە بەر نەشتەر؟
من کەی بەرگەی ئاشوبی ئەم هەموو گومانە ئەگرم؟
ژیانیان بەبارمتە لادانام و ئاسودەییان لێسەندم
پڕیان کردم لەسەنگدڵی و
دەست بە تاڵیشیان کردم لە میهرەبانی
پڕیان کردم لە گریان و شەرمیان کردە، برابەشی ژیانم

پڕیان کردم لە چۆڵوانی و ترس
خودایەکی چنگوپل خوێناویان کردە پاسەوانم
سادەترین من ئەگەر مابێت گریانە
کەناوێرم ناوی بێنم
موقەدەسترین خودا، لای من ئەگەر بوێرم بیلێم
شۆڕەبییەکە، لە قولایی تاریکیا
چاوی فرمێسکاوی لیمۆیەکی دراوسێی ئەسڕێ
تا قیامەت گریان
تا قیامەت چاوەڕوانی
تا قیامەت ژەنینی تار، بەدیار مایە پوچی ڕێگاکانەوە
تا قیامەت شکۆفەی باخچە، بەدیار باخەوانە نابیناکانەوە
تا قیامەت حیکمەتی ئاگر
بەدیار پاسەوانە مەنگۆلیەکانی دۆزەخەوە
هێندەی پڕیی باران پڕم لەمەلولی
هێندەی سەبری ئەیوب پڕم لە گلەیی
خوێندنەوەی ئەم بەیازانە، بۆ باڵەبانێکی کەڕ

وەك جوانی دەشتێك وەنەوشە وایە
لەبەردەم ڕەوەیەك جەنازەی جێماوا
پەنجەرەكان والآكەو ترست نەبێت
دەرگاكان بخە سەر پشت و پێویست بە قفلْ ناكات
ژیان بەقفلێكی گەورەتر داخراوە
خودایە جاران نامەی جوانت دەنوسی
لە ئینجیلا فێری خەوی ژێر داری زەیتونت كردم
لە زەبورا چاوت پڕ كردم لە میوە و
ڕۆحت پڕ كردم لە ژەنینی تەمبور و گۆرانی ئاژنت كردم
خودایە جاران لەنامە شەفەویەكانی شەوگارانی هاوینا
سەوەتە پێكەنینت بۆ دەناردم
دڵنیابە پێویستم بە نامەیە، لە تۆوە بێت
دەنا مەجبورم پێت بڵێم :
( هەتا قامی قیامەت ئاهو واوەیلا نەكەم چ بكەم )*
بەچی ئەچێ كاتیلەیەك ئاوی دەستی خەرامانێ
كەژیان ئەو هەمو خوێنەی لێبچۆڕێ

**بەچی ئەچێ سەبوری**
**کەژیان سەر لەبەری پرسە بێت**
**جوانی خوا بەچی ئەچێ؟**
**کە نەتوانم پرسیارێك و دەردە دڵێکی لا بکەم**
**دەسڕە مەخمەڵیەکەی ڕۆشنایم توند توند گوشی**
**یەك دڵۆپ ڕوناکی لێنەتکی**
**تمەز تەڕایی بڕ بوبو**
**ئیدی منیش مردم**
**ببورن نوستم**

*** مەحوی**